# تا کات نەڕۆشتووە، سوننەی مووسڵ ڕزگارکەن !

د. عبدالله محیسنی | و: هەڵگورد موسلیم

ئەی **ئەهلی سوننە**، پێش ئەوەی کات ودەرفەت بەسەرچێ مووسڵ ڕزگارکەن، ڕافیزە ئەمڕۆ تەواوی ویستیان خستۆتە حەلالکردن وداگیرکردنی ئەم شارەو ڕیشەکێش کردنی خەڵکەکەی، بێ ئەوەی هیچ گوێیەك بە ملیارێك ونیو موسوڵمان بدەن !

**مووسڵ** لە ڕۆژگارێکی مێژوودا چەندە پارێزگاری لە بەرامبەر کاروان وهەڵمەتی خاچ پەرستان دا لێ کردن، کە خەریك بوون لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامییەوە هەڵدەکشان. ئەو کات مووسڵ لەسەر دەستی ئەتابەکە ئازاو چاونەترسەکانی دا قسەی خۆی کرد ..

مێژوو چەندین قارەمانێتی وشکۆمەندی ئەتابەکەکانی مووسڵی لە لاپەڕەکانی خۆیدا تۆمارکردو جیهادێکی بەردەوامی بەرامبەر بە خاچ پەرستان بۆ ماوەی دەیان ساڵ بۆ نووسین، جا ئایا ئەو وەفادارییە لەگەڵ مووسڵدا دەکەن وئەگەر بۆ جارێکیش بێ لە بەرامبەر هێرشی ڕافیزەدا بەرگری لێ دەکەن ؟!

"مەودودی تونتکین" یەکەم کەسێك بوو کە جیهادی خاچ پەرستانی لە ئەستۆ گرت وسەرەتا توانی بەرپەرچیان داتەوە ودواتر کەوتە هێرش بۆ سەر کردنیان، ئەگەر دەستی بە غەدری ئیسماعیلییەکانیش نەبوایە، ئەو پیاوە مێژووی بە خۆی وکارەکانی سەرسام دەکرد !

ئەمە مووسڵە، ئەو دڕکەی لە قورگی خاچ پەرست وڕافیزەکان دایە؛ چ لە ڕۆژگاری ئەمڕۆو چ لە مێژوودا، **ئەهلی سوننە**؛ نەکەن پشتی لێ بکەن وبیدەنە دەستی ڕافیزەو پاروویەکی سووکی ڕافیزەی لە دین دەرچوو بێ !

ڕافیزە ئەمڕۆ **به بەهانەی شەڕی داعشەوە** دەیانەوێ تۆڵە لە هەموو ئەهلی سوننەتی مووسڵ بکەنەوەو، هیچ فەرق وجوایەزەکیشیان لە نێواندا ناکەن، بۆ خۆشتان بینیتان چۆن خەڵکیان بە دوای خۆیاندا ڕادەکێشا وئەشکەنجەو ئازاریان دەدان ودەیانسووتاندن !

هەموو گوێمان لە وتاربێژەکەی ڕافیزە بوو چۆن هانی خەڵکی دەدا دانیشتوانی مووسڵ بنبڕکەن، بە بەهانەی ئەوەی کە باب وباپیرانیان شوێنکەوتەی یەزید بوونەو، ئەم ڕۆڵانە – بە لافی ئەو – لەو باب وباپیرانەوەن .. ئەوان بەم جۆرە ڕق ودیدەوە شەڕ دەکەن ..

ئەمڕۆ ڕافیزە وخاچ وسەلیب بوونەتە یەك ودەستیان خستۆتە دەستی یەکتر، لە ئاسمانەوە فڕۆکەی ئەمریکا وسەربازەکانی ڕافیزە لە سەر ئەرز، مەبەست وئامانجیش **لە شەڕی داعش گەورەترە** .. ئامانجەکە ئەوەیە پێی ڕافیزە لە وڵاتی ئێمەدا قایم کرێ ..

ئامانج ئەوەیە **خوێن وگەردنمان بخرێتە ژێر دەستی ڕافیزە .. ئامانج ئەهلی سوننەو عەقیدەو دین وشەعائیر ودروشم وپیرۆزی وخاك وبوونی ئەهلی سوننەتە** .. ئامانج زۆر لەو وێنەی میدیاکان دەیکێشن گەورەترە !

خۆشەویستانم .. بەڵاکە زۆر گەورەیەو موسیبەتەکە یەکجار مەزنە، بۆیە بە هەرچی پێتان کرا پشتی ئەهلی سوننەتی مووسڵ بگرن وبەری مەدەن، دوعای زۆر بکەن ولە خوای گەورە بپاڕێنەوە بیانپارێزێت وپێگیر وجێگیریان بکا.

